# ئامانج لە دروستبوونی

# پەکەکە

## چەند بەڵگەنامەیەکی دزەپێکراو لە بارەیانەوە

ئامانج لە دروستبوونی پەکەکە

چەند بەڵگەنامەیەکی دزەپێکراو
لەبارەیانەوە

# ئامانج لە دروستبوونی پەکەکە
# چەند بەڵگەنامەیەکی دزەپێکراو لەبارەیانەوە

نوسینی
ئاریوس پۆلا

## دەربارە :

ناوی کتێب: ئامانج لە دروستبوونی پەکەکە چەند بەڵگەنامەیەکی دزەپێکراو لەبارەیانەوە

نوسەر: ئاریوس پۆڵا

دیزاین: شیمالی

پیاچوونەوە: پێگەی وردبین

ئامادەکردن: پێگەی وردبین

قەبارەی بەرگ: ٢١ × ٢٩,٧

---



بۆ هەر رەخنەو پێشنیارێک بۆ زیاتر بەرەو پێشچوونمان دەتوانن پەیوەندیمان پێوە بکەن

لەڕێی تێلیگرامەوە بەناونیشانی: https://t.me/pega.wirdbeen

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی

زۆر دەمێک بوو دەمویست نهێنی پەکەکە و مامەڵەکردنی لەگەڵ وڵاتاندا بزانم، بەتایبەتی دوای دەرکەوتنی ڕوویەکی دیکەی ئەم هێزە لەسوریا و ئێران.

دەمویست تێبگەم؛ بۆچی ئەم کیانە پشتی لە ئێران کردووە کە ڕۆژانە کوڕی کورد دەکوژێت؟! تەنها لەسەر وشەیەک و بە قەناس لە کۆڵبەرانی سەر سنور دەدات کە تەنها تاوانیان ئەوەیە دەیانەوێت پارویێک نان بۆ منداڵەکانیان پەیدا بکەن!!

دەمویست بزانم؛ چی وای کردووە لەگەڵ ڕژێمی سوریادا هاوپەیمانبن؟ جا هەر لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە تا نوسینی ئەم دێڕانە، لەکاتێکدا ئەو ڕژێمە ئامادە نەبوو تەنانەت ناسنامەی سوریش بدات بە کوردەکانی ئەو وڵاتە! ئنجا من زۆر کات گوێم لێبووە لەخەڵکی سوریا لەزاری ڕژێمەکەیانەوە دەیانگێڕایەوە کە وتوویەتی: "ئەم کوردانە پەنابەرن و سەردەمی جەنگی جیهانی و، پاشان لەشەڕی ناوخۆی عێراقدا هاتوونەتە وڵاتەکەمان و مافی تەنها مانەوەیان هەیە نەک ناسنامە!" کەچی بەم حاڵەوە پەکەکە لە ڕوحمیاندا هاتە دەرەوە و پێگەی یەکەم ئۆجالانی سەرکردەیان بوو!

دەمویست بزانم؛ بۆچی هێندەی دژی لایەنە ئیسلامییەکانی ناو تورکیان دژی عیلمانییەکان نیین؟! بۆچی لە قەندیل ژیانی موستەفا کەمال ئەتاتورک دەخوێنن و بەشانوباڵیدا هەڵدەدەن؟! بۆچی دەرنەکەوتن تا ئەوکاتەی ئیسلامی سیاسی لەتورکیا دەرکەوت بە سەرکردایەتی

زۆرێک و لەناویشیاندا دیارترینیان کە "ئەربەکان"ە؟!

پاشان لەدوایدا گەیشتم بە چەند پەنابەرێک و، هەواڵی ئەوەم لێبیستن کە لەسەر سنورەکانی تورکیا و یۆنان کورد هەیە! گەلێک پێم سەیربوو، بۆیە بەدوایداچووم و بۆم دەرکەوت کە ئەمانە پەکەکەن و مێژووی خزاندنیان بۆ ئەو ناوچەیە گەلێک دوورە!

پاشان تەماشای کەسایەتی و سەربازەکانی ناویانم کرد و بینیم کە گەلێک ئەرمەنی و عەلەوییان تێدایە و ٪۹۰شیان خۆیان بە موسوڵمان نازانن! لەگەڵ ئەوەی ئۆجالان خۆی بەوجۆرە دەرناخات هەرچەندە"عەلەوی"شە!

ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە ئەو سیاسەت ئەنجام دەدات و نابێت ناخی خۆی دەرببڕێت. بەڵام بۆ دەبێت یۆنان و ئەرمەن دەستیان لەناو پەکدا هەبێت؟! چی بەیەکەوە کۆی کردوونەتەوە؟! بۆ دەبێت لە عیفریندا قوله گەلێک بەدەستی ئەندازیارە ئیسرائیلییەکان بنیاتنرابێت؟! بۆچی زۆرێک لە ئەندامانی پەکەکە لەڕۆژئاوا هەمیشە ئاڵای کوردستان و ئیسرائیل پێکەوە هەڵدەکەن؟! ئایا پەکەکە باوەڕی بە کوردستانی گەورە و دەوڵەتی کوردی یەکگرتوو هەیە لەسەر ئاستی سەرکردایەتی حیزب؟! ئایا ئەسڵەن سەرکردایەتی پەکەکە کوردن؟!

بەدوای هەموو ئەمانەدا ڕۆیشتم و لەکۆتایدا گەیشتمە سەرئەنجامێکی زۆر مەترسیدار، بەتایبەتی بۆ تاکی موسوڵمان، چونکە لێرەدا ڕووی دەمم لە عەلمانی خۆفرۆش و لیبراڵی دۆڕاو نییە، بەڵکو ڕووم لەو موسوڵمانەیە کە هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوە ناوە بۆ گومانی باش بردن بەلایەنێکی وەکو پەکەکە.

بەداخەوە هەندێک مامۆستا کە دژایەتی ئیلحاد دەکەن، کەوتوونەتە ئەو هەڵە گەورەیەوە کە دوور نییە بەرەو دەرچوون لە ئیسلامیان ببات و

بەخۆیان نەزانن.

بۆیە دەمەوێت لێرەوە هەموو ئەوانە ئاگاداربکەمەوە کە سەراب دەبینن لەبیاباندا و وادەزانن ئاوە، ئەمەش بەیارمەتی خوای گەورە، پاشان هاوەڵێکی ئەزیزم کە ماوەیەکی زۆر لەناو پەکەکەدا بووە و بڕێکی باش زانیاری کۆکردووەتەوە و لەلای خۆی هەڵیگرتووە، پاشان هەندێک لە ئەندامانی کۆنی ئەم ڕێکخراوە کە لەئێستادا وازیان لێهێناون و ئاگاداری وردەکارییەکانن، هەروەها لەڕێگەی کەسانێکەوە توانراوە لە مەجلیسەکانیاندا زۆر زانیاری دزە پێبکرێت و پێمان گەیشتووە، لەگەڵ پشتبەستن بە کۆمەڵێک کتێب و سەرچاوەی دیکە کە لەدوایدا دەیانخەینەڕوو.

ئاریوس پۆلا

٧ی محرم/١٤٤٣کۆچی

١٧ی ئۆگەست/٢٠٢١زاینی

## گەڕانەوەی ئیسلام لە تورکیا و بەرەنگاربوونەوەی نێودەوڵەتی

لەدوای پەیماننامەی لۆزان، تورکیا بەیەکجاری بوو بە عەلمانی و، پاشان لە ١٩٢٤یشدا کۆتایی بەکۆتا چەتری موسوڵمانان هات لە جیهاندا و مەفهومی خیلافەت بوونی نەما.

ئەمەش وایکرد کە لەهەموو جیهانی ئیسلامییدا بەسەربەخۆیی کیانی ئیسلامی نوێ دروست ببێت بۆ گێڕانەوەی ئەو شکۆیە. بەڵام لە تورکیادا مستەفا کەمال بە ئاگر و ئاسن ڕووبەڕووی هەر هەوڵێکی لەم چەشنە دەبووەوە، هەربۆیە بەزوویی کۆتایی بە شۆڕشەکەی شێخ سەعید هێنا کە مۆرکێکی ئیسلامی پێوەبوو.

ئیدی لەناو کورددا هیچ کەسێک نەما داوای ئەو سیستمە بکاتەوە جارێکی تر، هەروەها تورکەکانیش زۆرێکیان لەژێر کاریگەری عەلمانیەتدا خۆیان لەگەڵ واقعدا گونجان و زۆرێکیش لەناوبران.

بەم چەشنە تورکیا بوو بە دەوڵەتێکی عەلمانی تەواو و، تەنانەت بانگدانیش کرا بەزمانی تورکی و عەمامەی مەلاکانیش لەسەر شەقامەکاندا قەدەغەکرا!

ئەم دۆخە بەردەوام بوو تا لەکۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی سەدەی ٢٠دا، وردە وردە ئیسلامییەکان لەبەرگی عەلمانیەتدا هەوڵی گەیشتن بەدەسەلاتیان دەدا، هەربۆیە دەوڵەتانی دەورووبەر بەخێرایی ویستیان دەست بەسەر دۆخەکەدا بگرن، چونکە دەیانزانی ئەو گەلە هەستیان کردووە بە ڕوخانی شکۆیان دوای نەمانی خیلافەت. ڕۆژێک بوو هەموو ئومەتی ئیسلامی ڕێزی لێدەنان و بەگەورە و ساداتیان دەزانین بەهۆی ئەو پلە گەورەیەی خێڵی عوسمان بۆیانی بەدەستهێنابوو.

بۆ ئەم مەبەستەش ڕەوتێکی ئیسلامی شاراوە پێکهێنرا لە تورکیادا، بۆیە کۆمەڵێک لە دەوڵەتانی دەرەوە شان بەشانی عەلمانییەکانی ناوەوە دەستیان کرد بە پیلانگێڕی بۆ کپکردنەوەی، جا بەشێوازی نەرمبێت یاخود توند و ڕەق. ئەوەش بەم جۆرە دەستی پێکرد و بەسێ قۆناغیشدا تێدەپەڕێت:

١. قۆناغی یەکەم: ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦٠-١٩٩١.

٢. قۆناغی دووهەم: ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٩١-٢٠٢١.

٣. قۆناغی سێهەم: ماوەی ساڵی ٢٠٢١ و ساڵانی داهاتوو.

## ماوەی ١٩٦٠-١٩٩١

لە دوای کودەتاکەی ١٩٦٠/٥/٢٧ لەلایەن سوپای تورکیاوە بەسەر سەرۆک کۆماری تورکیا "محمد جلال بایار" و سەرۆک وەزیران "عدنان مندریس"، ئەنجومەنی سوپا "جەمال کورسل"ی بە سەرۆکی تورکیا هەڵبژارد. سەرۆکی سەپێنراوی کودەتا لە ١٩٦١/٢/٧، یەکەم کاری ڕاسپاردنی هەردوو کونسوڵی فەرەنسا "هنری سبیتزمولر" و سەفیری یەکێتی سۆڤییەت "نیکیتا ریجوف" کە هەریەکەیان نامەی نوسراوی بانگهێشت کردنی سەرۆکی وڵاتەکانیان بگەیەنن، لەلایەن سەرۆکی تورکیاوە.

هۆکاری ئەم بانگێشتکردنە بۆ "هاوپەیمانیەتی ستراتیژی-سیاسی"بوو، لەپێناو ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەوتە ئیسلامییە سیاسییەکان و سیاسەتی ناوچەکە و پەیوەندی نێوان هەرسێ وڵات.

## دامەزراندنی یەکێتی و پەکەکە بە فەرمانی ڕۆژئاوا

١٩٦٩/١١/٩ "جەودەت صۆنای" سەرۆکی تورکیا هەریەکە لە سەفیری فەڕەنسا "گۆنتران بیگۆگنە" و سەفیری سۆڤییەت "أندریە سمیرنوف"ی ڕاسپارد، بۆئەوەی بە سەرۆکی وڵاتەکەیان ڕابگەیەنن کە بانگهێشت کراون بۆ تورکیا. سەرۆکی فەڕەنسا "جورج بومبیدۆ" و سەرۆکی سۆڤیەت "لیونید بریجنیف" ڕازی دەبن بە داوای بانگهێشتەکەی سەرۆکی تورکیا و لە ١٩٦٩/١٢/١٥ دەگەنە ئەنقەرە و ڕۆژی دواتر کۆدەبنەوە.

ڕێکەوتنەکەی پێشوویان نوێ دەکەنەوە و سەرۆکی فەرەنسا داوا دەکات وەزیرانی دەرەوەی وڵاتەکانیان کۆببنەوە بۆ گەیشتن بە ئەنجام، هەروەها نوێنەری هەریەک لە یۆنان و کۆماری ئەرمینیا بانگهێشتی کۆبوونەوەکان بکرێن، ئەمەش بۆ ئەوەی ببنە واجیهەی هەردوو وڵاتی زلهێز و لەجێی ئەوان کارەکان بەڕێوە ببەن.

وەزیرانی دەرەوە و نوێنەرانی نەتەوە بەژداربووەکان لە ١٩٦٩/١٢/٢٥ لە مۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەت کۆدەبنەوە:

- گوندوز ئۆکچون _ ج.و.د ترکیا

ئەوکات ئیحسان صەبری وەزیری دەرەوی تورکیا بەو کۆبوونەوە و دانوستان و ڕێکەوتنانە ڕازی نابێت، بۆیە سەرۆکی تورکیا جێگری وەزیری دەرەوە رادەسپێرێت تا بەژداری کۆبوونەوەکان بکات.

- موریس سومان _ و.د فەڕەنسا
- ئەلسکی رودیونوڤ _ و.د سۆڤیەت
- بالابیک مارتروسیان _ "بەرپرسی کاروباری دەرەوەی ئەرمینیا"

- پەنەجیۆتس پیپینێلس _ و.د یونان

دوای ئەوە بەڕیتانیاش بەهۆی سیاسەتی پاراستن و بەرگری لەمانەوەی ئیسرائیل دێتە پاڵ ڕێکەوتنەکە لە دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان لە ناوچەکە.

سەرۆک وەزیرانی بەڕیتانیا "هارولڵد ویڵسۆن" دەگاتە فەڕەنسا و، لەلایەن سەرۆکی فەڕەنسا "جورج بومبیدو" پێشوازی لێدەکرێت و بەیەکەوە کۆدەبنەوە.

سەرۆک وەزیرانی بەڕیتانیا پێشنیاری ئەوە دەکات کە وڵاتەکەی ئامادەیی تێدایە بچێتە پاڵ هاوپەیمانێتییەکە. هەربۆیە سەرۆکی فەڕەنسا بە نوێنەری وڵاتان رادەگەیەنێت کە ئەم هەواڵە بە سەرۆکی ولاتەکەیان ڕابگەیەنن، دوای ئەوە سەرۆکی وڵاتانی بەژدار لە هاوپەیمانێتییەکە بەهاتنی بەڕیتانیا ڕازی دەبن.

لە ١٩٧٣/٨/٥ لە سەر داوای سەرۆکی تورکیا "فخری قوروترک" و سەرۆکی سۆڤیەت "لیونید بریجنیف" و سەرۆکی فەڕەنسا "جورج بومبیدو" و سەرۆک وەزیرانی بریتانیا "ئدوارد هیس" و سەرۆکی کۆماری ئەرمینیا "ئەنتۆن کۆچینیان". هەروەها سەرۆک وەزیرانی ئەرمینیا "بدل موراديان" و سەرۆک وەزیرانی یۆنان "جیورجیوس بابادوبوس"، وەزیرانی دەرەوەی وڵاتەکانیان رادەسپێرن کە کۆببنەوە لە بارەی بڕیاری کۆتایی هاوپەیمانێتییەکە.

لە ٣رۆژ دواتر هەریەکە لە وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی بەژدار لە لەندەنی پایتەختی بەڕیتانیا کۆدەبنەوە لە ١٩٧٣/٨/٨، هەریەکە لە وەزیرانی وڵاتان:

- خلوق بای ئۆکلن _ و.د تورکیا
- موریس سۆمان _ و.د فەڕەنسا

- میشێل جوبرت _ ج.و.د فەڕەنسا
- فودور تینوف _ و.د سۆڤیەت
- دوگلاس هیوم _ و.د بەڕیتانیا
- کامۆ ئۆدومیان _ بەرپرسی کاروباری دەرەوەی ئەرمینیا
- جیورجیوس بابادوبولوس _ و.د یۆنان

بڕیار دەدەن نوێنەری بەرەی نارەزایی و ئۆپۆزسیۆنی کوردی لە تورکیا و عێراق و، کورد و فارسی_ئێران بەژداری بکەن لە کۆبوونەوەی داهاتوویان دا.

وەزیر و نوێنەرانی وڵاتانی بەژدار لە هاوپەیمانیەتیەکە لە ١٩٧٣/٨/١٥ کۆدەبنەوە هەریەکە لە "پاریس"ی پایتەختی فەڕەنسا. ڕۆژێک دواتر لە ١٩٧٣/٨/١٦ هەریەکە لە جەلال تاڵەبانی دەگاتە لەندەنی پایتەختی بەڕیتانیا و ئۆچ ئالانیش دەگاتە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا لە ١٩٧٣/٨/١٧.

جەلال تاڵەبانی لەگەڵ نوێنەرانی فەڕەنسا و بەڕیتانیا بۆ کاروباری ڕۆژهەلاتی ناوەند کۆدەبێتەوە و پلان و بەرنامەی هاوپەیمانێتییەکەی پێ ڕادەگەیەنن و باسی بەژداری تورکیا ناکەن.

دوای سێ کۆبوونەوە، جەلال تاڵەبانی دەزانێت تورکیا لە هاوپەیمانێتییەکەدایە، ڕازی نابێت و بڕیاری گەڕانەوە دەدات بۆ عێراق بۆ دامەزراندنی حیزب و بەرەیەکی نوێ.

وەزیری دەرەوەی بەڕیتانیا لەگەڵ بەرپرسی "بەشی هەواڵگری لە وەزارەتی دەرەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەند" بە جیا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دادەنیشن و، پێی دەڵێن: "گەر ڕازیش نابیت، هیچ نەبێت هەندێک پێشنیارمان هەیە بۆ گەڕانەوەت لە دامەزراندنی هەر هێزێک لە شام، حوکمەتی ئەسەد لەگەڵ فەڕەنسا ئاگاداردەکەینەوە کە هاوکاریتان بکەن!"

لە دوای گەڕانەوە؛ جەلال تاڵەبانی بۆچوونی دەگۆڕێت، بۆیە تاڵەبانی "یەکێتی نیشتیمانی" دادەمەزرێنێت و بەیاننامەی دامەزراندی یەکێتی بە زمانی عەرەبی لە ١٩٧٥/٥/٢٢ لەشام نووسی و بڵاویکردەوە.

ئۆچ ئالانیش لەهەمان رۆژ لە پاریس، لەگەڵ نوێنەری بەڕیتانیا و ڕوسیا و فەڕەنسا کۆدەبێتەوە و پێچەوانەی جەلال تاڵەبانی بە هەموو شتێک ڕازی دەبێت و، دوای حەوت زنجیرە کۆبوونەوە؛ بڕیار دەدەن کە ئۆچ ئالان (بگەڕێتەوە و پارتێکی سیاسی و سەربازی دابمەزرێنێت لە پێکهاتەی کوردی و ئەرمەنی و یۆنانی لەژێر ناوی خەبات و نەتەوایەتی کوردان. ئنجا ئایدیۆلۆژیای لەسەر بنەما شۆڕشگێڕییەکانی مارکسیزم-لینینیزم و نەتەوەخوازی کوردی بێت، هەروەها ڕاشیدەسپێرن دوای دامەزراندن، ڕوو بکاتە شام و لە "جەبەل لوبنان" بارەگای خۆی دابمەزرێنێت).

لە ١٩٧٨/١١/٢٧ لە دیاربەکر بە ئامادەبوونی ٢٢ کەس پارتی "کرێکارانی کوردستان"یان دامەزراند، پاشان ڕوویان کردە شام و بارەگایان دامەزراند، تا ١٩٨٤ دەچنە "جەبەل لوبنان" و هێزی سەربازی دادەمەزرێنن. لە دەشتی "بیقاع" بارەگا دەکەنەوە و یەکەم فیشەکیان بەڕووی سوپای ئیسرائیلدا دەتەقێنن تا سۆز و تێگەیشتنی خەڵکی بە عاقارێکی ترا ببەن، وای دەربخەن بۆ خەڵکی لوبنان کە ئەوان دژی داگیرکەرن، چونکە لەو کاتەدا بەشێکی زۆر لە "مقاومەی فەڵەستینی" لەو وڵاتەدا هەبوو، تەنانەت لە دوایدا ئیسرائیل باشوری لوبنانیشی داگیر کرد.

واتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت؛ هەردوو کەسایەتی لەیەک سەرچاوەوە پشتیوانی کراون بۆ جێبەجێکردنی پیلان و بەرنامەی وڵاتانی هاوپەیمانیەتییەکەی ساڵی ١٩٦١.

ئۆچ ئالان دوای دامەزراندنی پەکەکە لە ١٩٧٨ لە دیاربەکر، نوێنەری نارد بۆ وڵاتانی بەژدار لە هاوپەیمانیەت.

هەریەکە لە فەڕەنسا و سۆڤیەت و یۆنان و ئەرمینیا و بەڕیتانیا لەگەڵ وڵاتی شام "سوریا" پێشنیاری بۆدەکەن تورکیا بەجێبهێڵێت و بچێتە شام و لەوێشەوە بۆ "بیقاع".

دوای ئەوە لە ١٩٨٢ بۆ ١٩٨٤ تورکیا بەجێدەهێڵن و دەچنە شام و دوایش "جەبەل لوبنان" و لە دەشتی بیقاع معەسکەراتی تەدریبی و بارەگای سەرکردایەتی دادەمەزرێنن.

دوای ئەوە لە ڕێی فەڕەنساوە، وڵاتانی هاوپەیمانییەتی ئۆچ ئالان ئاگاداردەکەنەوە کە بارەگای سەربازی دووهەم و، چالاکییە چەکدارەکانیان بگوازنەوە بۆ "قەندیل" و، تیایدا خۆیان جێگیر بکەن و بیکەن بە هێڵی بەرگری دژی بەرەو پێشچوونی سوپای تورک لە هەر حالەتێکدا ئەگەر ئیسلامییەکان گەیشتنە دەسەڵات و حوکمەتیان کۆنترۆڵ کرد، ئەوا قەندیل بکەن بە بەربەستی رێگر لە بەرەو پێشچوون و گەڕانەوەیان بۆ سنوری خیلافەت.

## ئامانج لە دروستکردنی پەکەکە

ئامانجی دروستکردنی پەکەکە لەسەر داوای هاوپەیمانییەتی ئەو وڵاتانە لەسەر چەند خاڵێک ڕێکەوتنەکەیان کرد.

لەوانە:

- بەرگری لە ئیسرائیل بکەن.
- ٤ دەوڵەت بکەن بە هاو سنور لەسەر خاک و موڵکی کورد و تورک و عەرەب.
- بەشێوەیەک کار بکەن بۆ شێواندنی بیر و هۆشی موسوڵمانان و سەرەو ژێرکردنی حەق و باطڵ لەبەر چاویان.
- ڕێگری لە هێزە ئیسلامییەکان بکەن بەوەی ببنە جێگەی گومانی خەڵکی و شوێنیان نەکەون و شوێن هێزێکی وەک پەک بکەون.

سەبارەت بە ئێران؛ سۆڤیەت رادەسپێرن کە شیوعی و چەپەکان ناچار بکات پشتیوانی خومەینی بکەن.

تاکە لایەنی ئۆپۆزسیۆن ڕازی نابێت بە داواکەی سۆڤیەت "موجاهیدی خەلق"بوون، کە دوای شۆڕش و ڕاگەیاندنی کۆماری بەناو ئیسلامی، بەردەوام بوون لە دژایەتی کردنی حوکمەت. لە ساڵی ١٩٨٠ بارەگا و سەربازەکانیان گواستەوە بۆ عێراق و، لەگەڵ حوکمەتی عێراقی ڕێکەوتنیان کرد لە دژی کۆماری "سێدارە" و، ٨ ساڵ لەپاڵ سوپای عێراقیدا بەژداری جەنگی عێراق-ئێرانیان کرد، تا لە ساڵی ٢٠٠٣ بارەگاکانیان لە عێراق مابوونەوە وەک بەشێک لە پاراستنی ئەمنی قەومی و وەزارەتێکی عەسکەری عێراقی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا.

بەهەمان شێوە سۆڤیەت بەشێک لە عەلمانی و قەومییەکانی تورکیاشی

لە کورد و تورک ناچار کرد بچنە ڕیزی پەک و ئۆچ ئالان.

دوای ئەوەی لە نەورۆزی ساڵی ١٩٨٢دا مەزلوم دۆغان دەکوژرێت، دەست دەکرێت بە چالاکی و مانگرتن لەدژی حوکمەتی تورکیا لەلایەن پەکەکەوە.

لە ١٩٨٢/٧/١٤ چوار لە ئەندامانیان دەست دەکەن بە مانگرتن. "کەمال پیر دوای ٥٥ ڕۆژ، محمد خەیری دوای ٥٨ ڕۆژ، عاکیف یەلماز دوای ٦٦ ڕۆژ، علی چیچەک دوای ٦٧ ڕۆژ" لە مانگرتن دەمرن.

جگە لەو ژمارەیە؛ چەندین کەسی تر بەژداربوون لەو مانگرتنە، وەک مستەفا قەرەسو و ساکینە جانسز.

لە ١٩٨٤/٨/٥ شەڕی چەکداریان ڕاگەیاند چونکی لەماوەی ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٠ سلێمان دیمیریل لە حیزبی عەدالە، هەروەها لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٩ تورغوت ئۆزال و، لەنێوان ساڵانی ١٩٨٩-١٩٩١ یلدرم ئاقبولوت و مسعود یلماز لە حزبی وەتەن سەرۆک وەزیران بوون.

هەروەها لە ساڵی ١٩٨٠دا ئیحسان صبری "بێلایەنێکی نزیک لە فکری ئیسلامی". ١٩٨٩-١٩٩٣ تورکوت ئۆزال لە حیزبی وەتەن. ١٩٩٣ احمد حسام الدین کیندوروک سەرۆک کۆماری تورکیا بوون.

بەهەستکردن بەوەی کە ئیسلامییەکان ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبن و دەسەڵاتەکان دەگرنە دەست و زۆربەی سوڵتەکان کۆنترۆل دەکەن، بۆیە پەکەکە ڕاسپێردرا و ناچارکرا چالاکییەکانی لە سیاسییەوە بگۆڕێت بۆ چەکداری تا ماوەی حوکمی ئەوان ناشیرین بکات و بیانشێوێنێت لەبەر چاوی خەڵکی تورکیا.

هەر لەو سەردەمانەدا بوو؛ دوای ئەوەی خومەینیش لە ١٩٦٤دا

کە پەنای بردبووە بەر رۆژئاوا و لە فەڕەنسا مافی پەنابەری سیاسی وەرگرتبوو. لە هەمان ئەو ڕۆژەی ئۆچ ئالان و جەلال تاڵەبانی کۆدەبنەوە لە ١٩٧٣/٨/١٧دا بەجیا لەگەڵ چوارگۆشەی هاوپەیمانێتییەکە، لەگەڵ نوێنەر و وەزیرانی دەرەوەی فەڕەنسا و بەڕیتانیا و ڕوسیا کۆدەبێتەوە.

ئەوانیش لای خۆیانەوە ڕای دەسپێرن کە دەرفەتەکە بقۆزێتەوە و بەرقییە بدات، بۆئەوەی خەڵکی بە فەتواکانی جیهاد بکەن و لە هەر حاڵەتێکی تێکچوون و خراپتربوونی ڕەوشی ناوەخۆی ئێران، سواری شەپۆلەکان بێت و خۆی وەک ڕابەری شۆڕش ڕابگەیەنێت.

بۆیە خومەینی لە ساڵی ١٩٧٣وە تا کاتی گەڕانەوەی لە ١٩٧٩، ١٢٧ بەرقییە و بەیان دەردەکات و لە ساڵی ١٩٧٤دا مەلا مستەفا بەرقییەیەکی بۆ دەنێرێت و لە بەرقییەکەدا دەڵێت: "ئێمەش لەگەڵتداین و شان بەشانی تۆ جیهاد دەکەین و ئەمریکا و عەمیلەکانی لە لەناوچەکە دەردەکەین!"

هەر لەبەر ئەمە و چەند هۆکارێکی دی، مەلا مستەفایان بەپیلانێکی هاوبەش ناچار کرد بە ئاش بەتاڵ لەدوای ڕێکەوتنی جەزائیر.

ئەوە بوو خومەینی لە ١٩٧٨ بۆ ١٩٧٩ دەرفەتەکانی قۆستەوە و بەرهەمی چەند ساڵەی حیزبی تودە و موجاهیدی خەڵق و کورد و بەلوچ و عەرەبەکانی ئەوانەی دروێنە کرد. لەکاتێکدا شوێنکەوتەی حەوزەی عیلمی قوم کەمینە بوون لە شۆڕشەکەدا، چونکە لەسەر داوای فەڕەنسا؛ خومەینی لە ١٩٧٣دا رادەسپێردرێت کە خۆی ئامادە بکات بۆ سەرکردایەتیکردنی شۆڕش و ئێرانی نوێ. هەروەها حوکمەتی فەڕەنسا پشتیوانی دەکات لە ڕازیکردنی بەرە شیوعی و قەومییەکان، بۆئەوەی پشتیوانی بکەن لە سەرخستنی شۆڕشێکی بەناو ئیسلامی و دامەزراندی جمهوریەتێکی بەناو ئیسلامی، لەبەرامبەر ئەو مەددە سونییەی کە

لەوڵاتانی دەوروبەرەوە بەهۆی فیکری ئیخوانەوە هەڵدەتۆقی، تاوەکو ئەو بۆشاییە دەروونییەی موسوڵمانانی ناوچەکە پڕبکاتەوە، لانی کەم ببێتە هۆی دواخستنی بەرزبوونەوەی هێزە ئیسلامییە سونییە سیاسییەکان کە دەوری حوکمەتە قەومییەکانی ناوچەکەیان دابوو، هەروەها خزابوونە ناو دەسەڵاتیانەوە.

لێرەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە هەریەک لە پەکەکە و کۆماری بەناو ئیسلامی و یەکێتی نیشتیمانی، جێ ئاخوڕیان یەکێکە و یەک پیلانیش ئاڕاستەی کردوون. هەروەها ئامانج لە دروستکردنیشیان؛ ڕێگرتنە لە هاتنەوەی حوکمی ئیسلامی سونی لەناوچەکە.

ئەوجا با بێین و تەماشای کارگێڕ و سەرکردەکانی پەکەکە بکەین و لەڕێی زانینی ئینتماو نەتەوەیانەوە لە دۆخەکە حاڵی ببین.

## دامەزرێنەرانی پەک و لایەنگری وڵاتان

- عبدالله ئۆچ ئالان / عەلەوی / شیوعی لینینی
- سەکینە جانسز، "سارە" عەلەوی / ٢٠١٣ کوژراوە / خێڵی ئەسەد
- کەسیرە یڵدرم ناسراو بە کەسیرە بویتمان لەنێو پەکدا بە "فاتیمە"

ناسرابوو / خۆشەویستی ئۆچ ئالان.

کە لەکۆتاییدا بەتۆمەتی خیانەتکردن دادگایی کرا و سزای لەسێدارەدانی بۆ دەرکرا، بەڵام لەسێدارە نەدرا.

- علی حیدر قەیتان / ٢٠١٩ کوژراوە
- هاکی کارەر / ١٩٧٧ کوژراوە
- جەمیل بایک / ڕوسیا
- دوران کالکان / تورکیا_کەمالیستی
- مزلوم دۆغان / ١٩٨٢ کوژراوە / فەڕەنسا
- محمد خەیری دورموش / کوژراوە / تورکیا_دیموکراتی
- فاروق ئۆزدەمیر
- فەرزەندە تاغاچ
- عبدالله کومرال / عەلەوی-بنو ئەسەد
- شاهین دۆنمەر
- علی چەتینەر / تورکیا_کەمالیستی
- حسین تۆک گولەر / فرانسە
- علی گوریوز / عەلەوی
- رسول ئاڵتیۆک / قەومی
- سیف الدین زوغورلو / قەومی
- سوبحی کاراکۆش / دیموکراتی
- محمد جاهید شەنەر / عەلەوی
- محمد دوران / کەمالیستی
- عەباس گۆگ تاس / عەلەوی

## پەکەکە لە نزیکەوە

لە ساڵی ٢٠٢٠دا سێ هەوڵی کودەتا هەبووە بەسەر موراد قەرەیلاندا لەلایەن جەمیل بایک و مستەفا قەرەس و دۆران کاڵکان و ئەحمەد دێنیز و بەسێ هۆزات، بەڵام بەر لە ئەنجامدانی پوچەڵکراوەتەوە.

بە فەرمانی "جەمیل بایک و موراد قەرەیلان" مەلەفی سەلاحەدین دەمیرتاش گەیەندراوەتە قونسوڵی تورکیا لەهەولێر، تا تورکیا دەستگیری بکات و، بارەگای هەدەپە دابخات تەنها لەبەرئەوەی دەمیرتاش لەم دواییانە بەپەیڕەوی پەکەکە کاری نەدەکرد و لای خەڵکیش زیاد لە حەد خۆشەویست بوو بوو. ترسیشیان لەوە هەبووە کە ببێتە جێگرەوەی خودی ئۆچ ئالان لە پێگەی جەماوەری، چونکی نزیکی ٧٠ کورسی پەرلەمانی بەدەست هێنا، بۆیە مەلەفیان بۆ دروست کرد لەرێی سیخورەکانیانەوە. هەر لەبەر ئەمە لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠١٦ دەستگیر دەکرێت.

(ع.س.پ) بەرپرسی رێکخستنەکانی پەکەکە بووە لە ناوچەی برادۆست لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٩٢ بۆ ١٩٩٧دا. لە دوایشدا لە ٢٠٠٣ خۆی ڕادەستی پارتی دەکاتەوە و ئێستا کەسێکی دەست رۆیشتووی شاری سۆرانە لە ناو پارتیش ڕێز لێگیراوە. دەگێڕێتەوە لەو ماوەیەی کە ئەو بەرپرسی پەکەکە بووە چۆن خەڵکی ناوچەکەیان ئەشکەنجە داوە و چۆن باج و سەرانەیان بەزۆر لەخەڵکی وەرگرتووە!

(ع.س.ب) لە باس کردنی ئەشکەنجەدانی ٤٥ مەلای ناوچەکەدا دەڵێت: "هەر مەلایەکمان دەستگیر دەکرد، لەسەرمای زستان لەناو بەفر جلەکانمان لەبەر دەکردنەوە و لە عامودێکمان دەبەستانەوە بەدرێژایی شەو. هەر سەعاتێک جارێک، یەک (تەنەکە) بەفراومان پێدا دەکردن تەنها لەبەرئەوەی کچ و کوڕێکی لەیەکتر مارە کردبوو بە شەرعی خودا

و پێغەمبەر!"

لە باسێکی تردا باسی دادگایی کردنی خەڵکی دەکات لەنێوان ستەمکار و ستەملێکراودا و، دەڵێت:

"کاتێک دوو کەس یان دوو بنەماڵە دەبووە کێشەیان -بۆنمونە لەسەر پارە- بەم شێوەیە کێشەکەمان کۆتایی پێدەهێنا؛ گەر کەسێک ٣ هەزار دیناری کەسێکی خواردبا و نەیدابایەوە شکاتی کردبا، ئەوە ئێمە دەچووین ٦ هەزارمان لەو کابرایەی کە ٣ هەزارەکەی خوارد بوو دەسەند و، تێر شەقیشمان دەکرد و هەڕەشەمان لێدەکرد کە جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە، هەروەها لەو ٦ هەزارەی لێمان سەندەوە ١٥٠٠ دینارمان دەگەڕاندەوە بۆ کابرای خاوەن پارەکە!"

هەروەها دەشلێت: "ئەوە وەک زەریبە و حەقی دادگەری، چەندی پارەی خەڵکی لابووە، ئەوەندەی زەریبەی لێوەردەگیرێت. هەروەها ئەو کابرایەی پارەی لێ زەوت کراوە حەقەکەی چەند بێت، ئەوا نیوەی دەبێت وەک زەریبە بدات."

نوسەر و رۆژنامەنوسی عەرەبی میسڕی بەڕەگەز لوبنانی لە کتێبی "صرطان الأمة في شمال أراضينا" -کە مەبەستی نوسەر، رێکخراوی پەکەکەیە- لە لاپەڕەی ٤٥ی کتێبەکەیدا باس لە گەشتێکی رۆژنامەوانی سیاسی دەکات لەگەڵ کۆمەڵێک رۆژنامەوان و چاودێری سیاسی تر.

دەڵێت: "لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی دەنگۆی دروستبوونی هێزێکی شۆڕشگێڕی کوردی لە تورکیادا، لە دژی دەسەڵاتی عەلمانیەتی قەومی و تورکی کەمالیستی، ئێمە وەک سیاسی و رۆژنامەنوسە گەنجەکانی عەرەب، زۆر دڵخۆش بووین کە شۆڕشێک بەرپا بووە. ڕۆژبەڕۆژ بە پەرۆشەوە چاوەڕێی هەواڵی خۆشمان دەکرد، بەدوای رۆژنامەکاندا دەگەڕاین تا بزانین کام رۆژنامەیە باسی چالاکی و کارەکانی حزبی

عمال "پەکەکە" دەکات لەدژی کۆماری تورکیا.

نوسەر دەڵێت:

"بۆیە بەمەبەستی لە نزیکەوە ناسینیان لە ١٩٨٥/٦/١٩ کۆمەڵێک لە رۆژنامەوان و چاودێرانی سیاسی لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی کۆبووینەوە لە قاهیرەی پایتەختی مصر کە ژمارەمان دەگەیشتە ١٣٠ کەس لە چاودێرانی سیاسی عەرەبی_ئیسلامی. گەشتینە بڕیاری ئەوەی کە گەشتێک بۆ ناوچەی بیقاعی لوبنان بە مەبەستی توێژینەوە کردن و ناساندنی پەکەکە و سەرانی حیزبەکە بکەین، تاوەکو لەنزیکەوە بیان دوێنین."

بە پێنج پاس (منشأ) لە "مصر"ەوە کەوتینە ڕێ، چونکی پێمان خۆش بوو گەشتێکی درێژخایەن بکەین و خۆشیش ببینین لە پاڵ کارەکەمان کە رۆژنامەوانی بوو. گەشتەکەمان ١٣٥ ڕۆژی خایاند، لە مصرەوە بەڕێکەوتین بۆ خاکی ئەردەن، ئینجا بۆ سوریا و دوایی بۆ لوبنان تا گەیشتینە لوبنان ١٥ رۆژی خایاند، بەهۆی ئەوەی لە ناوچە گەشتیارییەکان پشوومان دەدا و شەو دەماینەوە.

ئینجا کەوتینە ڕێ بۆ شاخەکانی لوبنان و دەشتی بیقاع کە بارەگای سەرەکی پەکەکە و نوسینگەی ئۆچ ئالانی لێبوو.

کاتێک چووینە نێو بارەگاکە و گەیشتین بە بارەگای تایبەتی ئۆچ ئالان، هیچ پیاوێکمان نەبینی جگە لە ئۆچ ئالان و ٣ هاوکار و سەرکردەی تری پەکەکە! توشی سەرسوڕمان بووین هەر لەیەکەم ساتی گەیشتنمان.

دوای ٣ رۆژ مانەوە هەستمان دەکرد هێواش هێواش ژمارەی پاسەوان و چەکدارەکان زیاد دەکات تا ڕۆژی سێهەم ژمارەیان گەیشتە ١٢٥ چەکدار، بەڵام چ چەکدارێک بوون؟

چەکدارەکان کچە نازدار و ڕۆح سوکەکانی کورد و تورک و ئەرمەن بوون کە تەمەنیان لەنێوان ١٧ بۆ ٢٥ ساڵاندا بوون!

دوای لێکۆڵینەوەمان گەیشتینە ئەوە زانیاریەی ئەو کچانە یان فریو دراون بەناوی ئازادی و مافی ئافرەتان، یان لەتەمەنێکی کەمدا ڕفێندروان و لە هەست و سۆزی دایک و باوکیان دوورخراونەتەوە، بۆئەوەی ببن بە مرۆڤ گەلێکی دڕندە و لە مێینەیی خۆیان بگۆڕدرێن. بۆیە هەر ئەو کاتە تێگەیشتن ئۆچ ئالان و جەماعەتەکەی چ شەیتانێکن لەپێست و بەرگی مرۆڤ دا!! تێگەیشتن ئۆچ ئالان لە مێبازێک زیاتر هیچی تر نییە.

دوای تەواوبوونی گەشتەکەمان و بڕیاری گەڕانەوەمان لە ئوردن، لەگەڵ گەیشتن بە سنوری مصر، لەوێ لە میوانخانەیەکی سەر سنور لاماندا. چەند مێزێک پێکەوە لکێندرا بۆئەوەی بەیەکەوە کۆببینەوە، ئەوە بوو لەکاتی نان خواردن بووین بە پێنج بەش؛ ئەو دیمەنانەی لە بیقاع بینیبوومان، لە دڵمدا بوو بووبە گرێ و حەزم دەکرد بزانم هاوڕێ و براکانیشم وەک من تێگەیشتوون و درکیان پێ کردووە؟

لەکاتی نان خواردن وتم: "برادەران چی نامۆتان بینی لە ماوەی مانەوەمان لە بیقاع؟

ئایا ئەوەی من بینیم ئێوەش بینیتان؟ ئەوەی من هەستم پێی کرد و شعورم بۆی جوڵاوە، ئێوەش هەستتان پێکردووە؟ ئەرێ ئەو هەموو کچە نازدارە بەدەوری چوار پیاوەوە بوون مانای چییە؟

ئەرێ ١٢٥ کچی تەمەن ١٧ بۆ ٢٥ ساڵ، بەناوی پاسەوانی کردنی چوار پیاو ناو دەنێن چی؟  لەم ناوچە چۆڵەی شاخەکانی لوبنان و دەشتی بیقاعەدا!"

هەموو سەیری یەکیان کرد و، وتیان بەڵێ ئێمەش وامان هەست کردووە.

دەڵێت بۆیە کاتێک گەیشتینەوە مصر؛ حەوت کەسمان بڕیارماندا دیراساتی تەواوی ژیانی ئۆچ ئالان و شوێنکەوتەکانی بکەین. بۆیە گەیشتین بە شکستی ئۆچ ئالان لە پەیوەندی خۆشەویستی، دەروونی ئۆچ ئالانی تێکشکاندووە لەبەرئەوەی کەسێکی خۆپەرست و خۆ بەزلزان بووە.

## کەسیرە بویتمان خۆشەویستەکەی ئۆچ ئالان

کەسیرە بویتمان یان "کەسیرە یڵدرم" لەناو پەکەکە دا بە فاطیمە ناسرابوو.

لە ساڵانی زانکۆ ئۆچ ئالان بە کچە کوردێکی عەلەوی ئاشنا دەبێت و، دوای ماوەیەک عاشقی دەبێت. ئەو کچە دەبێتە هاوکاری سیاسی و چالاکییەکانی ئۆچ ئالان بۆماوەی زیاتر لە ١٠ ساڵ، تا ساڵی ١٩٧٣وە لە ماوەی دامەزراندنی پەکەکە لە ساڵی ١٩٧٨ لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر بووە. دوای ئەوەی ئۆچ ئالان دەچێتە شام و بارەگا لە دەشتی بیقاع دادەمەزرێنن، کەسیرە بویتمان دوای ٢ ساڵ خۆی دەگەیەنێتە بیقاع.

سەرەنجام ئۆجەلان عاشقی فاتمە دەبێت، بەڵام کەسە نزیکەکانی بەگومان بوون لێی و چەندین جار پێیدەڵێن: "ئاگات لەو کچە بێت".

تا دەگات بەوەی بیریان لەکوشتنی کردەوە، لەبەرئەوەی بووە بەنزیکترین کەسی ئۆجەلان و بەمەترسییەکی گەورەیان داناوە لەسەر ژیان و بیرکردنەوەی.

ئەوەش قسەی جەمیل بایک و چەند بەرپرسێکی تری پەکەکەیە.

## پیلانی کوشتنی فاتمە

جەمیل بایک سەبارەت بەپیلانی کوشتنی فاتمە دەڵێت: "ساڵی ١٩٧٨ لەدیاربەکر، من و سەرۆک ئاپۆ و هەڤاڵ خەیری و فاتمە بەیەکەوە لەماڵێکدا بووین، هەندێک گفتوگۆ لەنێوان سەرۆک و فاتمە دەرکەوت. بێگومان لەبەرئەوەی سەرۆک لەوێ بوو، بۆئەوەی بێڕێزی دەرنەکەوێت ئێمە هیچ مداخەلەمان نەکرد. فاتمە بەشێوەیەک دەچووە سەر سەرۆک کە دەیویست بیجوڵێنێت، بەڵام ئامانجی فاتمە بۆ ئەوەبوو شتێک بکەین، بەڵام سەرۆک بۆئەوەی پیلانی فاتمە پوچەڵ بکاتەوەماڵی بەجێهێشت. دواتر هەڤاڵ خەیری ویستی هەندێک شت بەفاتمە بڵێت بەڵام ئەمجارە دژی ئەویش ڕاوەستا. بۆیە من بەهەڤاڵ خەیریم وت ئەوە مرۆڤ نییە ئەوە جانەوەرە، وەرە بائێمەش دەرکەوین، من نەمدەتوانی خۆم ڕابگرم چونکە دەمزانی ئەگەر لەوێ بمێنمەوە، فاتمە دەکوژم بۆیە منیش لەماڵ دەرکەوتم.

ماوەیەک دوای ئەوە هەڤاڵ کەمال پیرم بینی و لەم بابەتە ئاگادارم کردەوە. هەڤاڵ کەمال وتی: "ئەگەر ڕەوشەکە بەم شێوەیە بێت باشتر ئەوەیە بیکوژین، چونکە هەتا ئێستا زیانێکی زۆری بەئێمە گەیاندوە، ئیتر بەسە."

هەروەها لەبەرئەوەی بێڕێزی بەرامبەر بەسەرۆک کردووە کوشتنی خۆی هەق کردووە. سەرۆک لەلای هەڤاڵ کەمال پیر زۆر جیاواز بوو، فاتمە بۆهەرکەسێکی تر چی گوتبایە ئەوەندە گرنگی پێ نەدەدا، بەڵام باوەڕێکی بەهێزی بەسەرۆک هەبوو، بۆیە گوتی: "ئەگەر فاتمە بەم شێوەیە نزیکی سەرۆک بووبێتەوە ئیتر پێویستە بکوژرێت."

کاتێک فاتمەمان نەکوشت و هەڤاڵ کەمال پیر کەوتە زیندان، بەڵام لەزیندان و لەدواڕۆژەکانی ژیانیدا، بەهەڤاڵ ماشەڵا خۆجە دەڵێت ئەگەر

لەزیندان دەرکەوتی بەهەڤاڵ جومعە (جەمیل بایک) بڵێ ئەو کارەی لەساڵی ١٩٧٨دا دەمانویست ئەنجامی بدەین لەبیری نەکات.

کاتێکیش هەڤاڵ ماشەڵا لەزیندان دەرکەوت و، چووە لای سەرۆک لەبیقاع، لەپرسیاری سەرۆکدا دەربارەی ڕەوشی زیندان، هەڤاڵ ماشاڵا بەسەرۆک دەڵێت: "لەدوارۆژەکانی ژیانیدا هەڤاڵ کەمال پیر شتێکی وای پێگوتووم." سەرۆکیش دەڵێت: "من نازانم و زانیاریم نییە لەسەر ئەو بابەتە!"

جەمیل بایک دەشڵێت: "دواتر هەڤاڵ ماشەڵا بەخۆمی وت، منیش بەسەرۆکم وت کە پلانێکی وامان هەبووە، سەرۆک وتی باش بوو ئەوکارەتان نەکردووە، چونکە لەو کاتەدا زیانێکی زۆرمان بەردەکەوت".

## فاتمە لەدیدی ئۆجەلانەوە

ئۆجالان لەوەسفی فاتمەدا دەڵێت: "ئەو ژنە خاوەن کەسایەتییەکی هاوشێوەی گورگ بوو، لەو راستییە تێگەیشتبوو دەیزانی هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدەم. دۆخە سۆزدارییەکەم بوو بووبە کێشەیەکی جدی، بەڵام هەوڵم دەدا کێشەکانم لای گروپ ڕەنگ نەداتەوە. لەوبڕوایەشدا نەبووم مەیلێکی زایەندی هەبووبێت، مسۆگەر لەبواری مەیلی زایەندی یان سێکسەوە یەکێکی زاڵ بوو، بۆیە لەو لایەنەوە بەهەڵەدا چووبووم. سەرەڕای نەبوونی ئەو هێزەی بەدەستی بێنم، بەڵام پێداگریم کرد و پەیوەندیەکەم تا ئاستی هاوسەرگیریەکی ڕووکەش و یەکلایەنە بوو، بەڵام هاوسەرگیر ڕاستەقینەمان نەکرد."

## ئەو تۆمەتانەی خراونەتە پاڵ کەسیرە بویتمان

قەرەیلان دەڵێت: "فاتمە کەسایەتییەکی کاریگەر بوو، کاریگەری زۆری لەسەر هەموو پیاوەکان هەبوو، تەنانەت ئەوانەشی کە سەرکردەبوون لەنێو پەکەکەدا، ئەم ژنە دەیویست خۆی ببێت بەسەرۆکی پەکەکە و جێگە بەئۆجەلان لێژ بکات."

قەریلان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "کە بیرم دەکردەوە ئافرەت ئەوەندە کاریگەری لەسەر پیاو هەبێت زۆر گرنگە بتوانرێت بەدیوێکی تردا بەکاربهێنرێت".

هەرچەندە ئۆجەلان زۆرهەوڵی داوە کاریگەری لەسەر فاتمە دابنێت و لایەنە خراپەکانی مەحکوم بکات، بەڵام وەک ئەو دەڵێت: "دەرئەنجام فاتمە نەگۆڕا و لەهەموو ڕوویەکەوە لەخیانەت ڕۆچووبوو، نوێنەرایەتی دەوڵەتی تورکی کردووە لەتەنیشت ئۆجەلانەوە."

ئۆجەلان دەڵێت: "سەرکەوتن بەسەر فاتمەدا سەرکەوتنی من بوو بەسەر کەمالیزمدا، فاتمە لەتەنیشتمدا دەوڵەتێکی زۆر بەتوانا بوو، ئەگەر بکەوتایەتە خزمەتی شۆڕش ئەوا ڕۆڵی سەرۆکایەتییەکی گرنگی دەگێرا، بەڵام فاتمە نەگۆڕا و زۆر ڕۆچووبوو لەسیستەمی کەمالیزمدا."

ساڵی ١٩٨٦ تەواوی کارە نهێنی و سیخوڕییەکانی ئاشکرا دەکرێت و لەدەشتی بیقاع دادگایی دەکرێت و بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت.

فاتمە خۆی دان بەوەدا دەنێت کە لەساڵی ١٩٧٣وە لەلایەن تورکیاوە لەگەڵ کەسێکی تردا بەناوی پیرۆت، هاتوون تاوەکو ئۆجەلان لەخشتە بەرن. پیرۆتیش ویستوویەتی لەڕێگەی پارەوە کار لەسەر ئۆجەلان بکات بەڵام پیرۆت سەرکەوتوونابێت.

## هەڵویستی ئۆجالان لەسەر دادگاییەکەی فاتمە

کاتێک فاتمە دادگایی دەکەن و ئەو پێشتر خۆی دانی ناوە بەهەموو شتێکدا و، دادگاش بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەکات. بەڵام ئۆجەلان دەڵێت: "پێویست ناکات لەسێدارەی بدەن چونکە من دەمێکە وەک سیستەم و وەک فەلسەفە و وەک ئایدۆلۆژیا لەناو خۆمدا لەسێدارەم داوە!"

چونکە ئەوە دە ساڵە هەوڵ دەدات، چەند کەسی لەگەڵدایە؟ چی پێکرا؟ بێگومان هیچ، بۆیە پێویست ناکات وەک فیزیک لەسێدارەی بدەن با ئازاد بێت.

دواتر ئازادی دەکەن و بەویستی خۆی دەچێتە ئەڵمانیا و دەڵێن ئێستا لەو وڵاتە نیشتەجێیە و، لە ژیان دا ماوە بەڵام لە ساڵی ٢٠١٧ دەنگۆی تیرۆر کردنی بڵاو دەکرێتەوە.

جا لێرەدا ئەوەی پێویستە بیڵێم ئەوەیە لەدوای ساڵی ١٩٨٠ پەیڕەوی پەکەکە گۆرانکاری تێدا کراوە و بڕگەی قەدەغەی هاوسەرگیری جێگیر کراوە لە نێوان شوێنکەوتەکانیان. ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە ئۆچ ئالان دوای ئەوەی شکست دەهێنێت لە پەیوەندی خۆشەویستی و پێکهێنانی هاوسەرگیری، بڕیار دەدات هاوسەرگیری قەدەغە بکات لە شوێنکەوتوانی. ئەوەش دەرخەری کاریگەری ئەو قین و بوغزەیە کە شکستی هێناوە، بۆیە بەڕەوای نەزانیووە شوێنکەوتەکانی ژیانی هاوسەری پێکبهێنن و چێژی ئەو ژیانە ببینن لەکاتێکدا خۆی ئەو هەست و چێژەی نەبینیبێت و پێی نەگەیشتبێت.

لەڕاستیدا پەکەکە هیچ نییە جگە ئۆجالان، ئەو نەک تەنها سەرۆکە، بەڵکو فەرماندەی ڕوحی و پەیامبەر و بگرە خوداشیانە!

ئەوانەی کە لەناو پەکەکە ژیاون دەزانن کە وشەی ئۆجالان و هێنانی

ئەو ناوە ئەسڵەن بەم جۆرە قەدەغەیە، بەڵکو دەبێت بوترێت "سەرۆک یاخود ئاپۆ". هەروەها ژیاننامە و پەیامەکەی یەکەم خاڵی هەڤالانە و لادان لەهەر وردوپردێکی ڕێبازەکەی واتە لادان لەئیمان و ویژدان!

هەروەکو چۆن ئێمەی موسوڵمان لادان لەپەیامی الله بەدەرچوون لە ئیسلام لەقەڵەم دەدەین، بۆیە دەتوانین بڵێین هوبەل و ئامونی ئەمڕۆ بۆ پەکەکە بریتیە لە ئۆجالان و، تەنانەت لە وردەکارییەکانی ژیانیشیاندا پشت بەو خالانە دەبەستن کە ئۆچ ئالان دایناوە.

## شاهیدی سەربازێکی پەکەکە

شایەتی برایەکی بەڕێزمان کە بۆ ماوەیەک لەقەندیل سەرباز بووە، لەگەڵ بوونی نزیکی خودی خۆی لەهەندێک لەو کەسانەی لە دامەزراندنی پەکەکەدا بەژداربوون و ئاگای لە وردەکاری گەلێکی زۆرە.

خۆم و ٢٤ برادەری تر لە ٢٠٠٨/٨/٣ لە هەولێرەوە لەڕێگای هێمن قەساب ناسراو بە "هاوڕێ مەخموری" بۆ سۆران و لەوێشەوە چوین بەرەو ناوچەکانی برادۆست کە لەژێر دەسەڵاتی پەکەکە دابوو.

لە سۆران ناونیشانی کەسێکیان پێدا بووین بە ناوی عیسا مزوری کە لەناو پەکەکەدا ناسرا بوو بە "دارۆ پەکەکە". دارۆ پەکەکە لەگەڵ ٣ تەنزیمی تر ناوەکانیانم بیر نەماوە ئێمەیان بردە ناوچەی زێوەی سەر بە سۆران، لەوێ بەسەر ٣ماڵدا دابەشیان کردین.

ئەو ماڵەی ئێمە چووین خاوەن ماڵ ناوی "دەروێش کەریم" بوو، دەرویش کەریم تەنزیمی پەکەکە بوو لە زێوە، دوای گەڕانەوەمان بۆمان دەرکەوت کادری ناوچەی پارتیشە لە سۆران جاسوسی دەکات بۆ پەکەکە لە ناوچەی سۆران!

شەو لە زێوەماینەوە، پاشان رۆژی دواتر دوای نانی ئێوارە سێ سەیارەی جۆری پیک ئاپ تۆیۆتا و نیسانێک و مێگزەمینێکی لانکرۆزەر گەشتنە بەردەم ماڵی دەروێش، سەعاتەکانیان لێ سەندین و ئێمەیان کۆکردەوە و بەبێ دەنگی و هێمنی سەرکەوتین و، کاتێک نزیک دەبووینەوە لەهەر دێ و ناحیە و ئاوەدانییەک لایتەکانیان هەڵدەکرد و دوای دەرچوون لە ئاوەدانی دووبارە دەیان کوژاندەوە.

لایتەکانیان دەکوژاندەوە هەم بۆئەوەی ئێمە نەزانین بە چ ڕێگایەک

دەڕۆین و ڕێگاکان نەناسینەوە بەتاریکی چونکی ڕێگاکان ڕێگای گشتی نەبوون، بەهەمان شێوە لەبەر هێرشی ئاسمانی و سوپای تورکیا. سەعاتەکانیشیان لێسەندین بۆئەوەی کاتی نێوان ناوچەکان نەزانین.

ماوەیەک بە ڕێگاوە بووین بە ڕێگای قەدبڕ و خۆلاوی و دژوار، درەنگی شەو بوو گەیشتینە ناوچەکانی دامێنی چیای کارۆخ و لە "دەرگەڵە" دووبارە دابەشیان کردین بەسەر چەندماڵێکدا. خاوەنی ئەو ماڵەی کە ئێمە لێیماینەوە پێیان دەوت "هەڤاڵ جەمیل"، دوو شەو لەوێ ماینەوە.

بەیانیەکەی وتیان خۆتان ئامادە بکەن بۆئەوەی سەر لە ئێوارە بەڕێ بکەوین، دوای نانی ئێوارە دووبارە سێ سەیارەی تر هاتن سەیارەکانیان گۆڕی بوو.

دووبارە بەڕێکەوتین تا گەیشتینە ناحیەی وەرتێ، دابەشیان کردینەوە بەسەر چەند ماڵێکدا، ئەو ماڵەی ئێمەیان بۆ برد بەرامبەر مزگەوتی وەرتێ بوو، خاوەن ماڵ بە "مامۆستا هۆشیار" بانگ دەکرا.

شەوی دواتر بەڕێ کەوتینەوە ئەمجار گەیشتینە دێی "جەلالە" سەر بە قەزای چۆمان و لەوێ نانیان پێدایین و، دوای ماوەیەکی کەم کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە دێی "درابەند"ی سەر بە چۆمان لەوێشەوە بۆ ناوچەی "ڕایات" سێ دێی نزیک یەکن و ژمارەی ماڵەکانیان ٣٠ ماڵ دەبوو. ئەو سێ دێیە وای بۆ دەچووم خۆیان ئاوەدانیان کردبێتەوە چونکی هیچ ڕێگایەکی بۆ نەدەچوو تەنها ئەو ڕێگا ناخۆشانەی خۆیان ڕێیان پێدا دەکرد.

شەو لەوێ ماینەوە و ڕۆژی دواتر لەگەڵ تاریک داهات دووبارە بەڕێ کەوتینەوە ئێمەیان بردە "ماشکان"ی سەر بە پیرانشار، لەوێ لەماڵی "حەمید ئاغا" ماینەوە شەوی دواتر لەوێوە بۆ "کێلەشین" و لەوێشەوە بۆ

"زێوە"ی ئێران دوو شەو ماینەوە لە مالی "رۆستەم حاجی ئاغا". شەوی دووهەم پیاوێک هاتە لامان پێیان دەوت "هەڤاڵ ئاگرین" بە "برادەر"یش ناسرا بوو لەناو پەکدا، قسەی بۆکردین کە سبەی شەو دەچینە بارەگا و لەوێ دەست دەکەین بە پەروەردە کردنتان لە مەدرەسەی ئاپۆ.

ئەوە بوو ئێمەیان بەڕێ کرد بۆ قەندیل، ئەمجار نەوەستاین تا گەشتینە "بیصور" کە لە دوایدا هاتووچۆمان پێ دەکرا لە دامێنی چیای بەردەسپی لە نێوان دێیەکانی و بیصور و بۆڵا و دەکار.

زیاتر لە ١٥ ڕۆژ لەو دێیانە ماینەوە، دواتر ئێمەیان بردە دێی "شوشین" و ٦ ڕۆژ لەوێ ماینەوە. دوای ئەوە ئێمەیان برد بۆ دێی "جەڕە" شەوی دواتر هێنایانینەوە بۆ دێی بۆڵا و ٣ شەویش لەوێ ماینەوە. دواتر بۆ "ڕەزانوک" و شەوی دواتر بۆ ناحیەی "وەرتێ" گەڕاینەوە و، لە لەماڵی مامۆستا هۆشیار ماینەوە.

شەوی دواتر لە ٢٠٠٨/٨/١٧ بەڕێ کەوتین بۆ قەندیل لە ٢٠٠٨/٨/١٨ یەکەم شوێن لە قەندیل پشومان لێیدا، شوێنێک بوو بەناوی کوخی "حاجی ئیبراهیم" کە کوخێک و چەند خانوێکی لێبوو چۆڵ بوون جگە لە ماڵی حاجی ئیبراهیم کەسی تر لەوێ نەدەژیا، پەکەکە هەموو شتێکیان بۆ دەهێنا. حەفتەیەک لەوێ ماینەوە دوایی چووینە دێی "چنارە" کە یەکەم شوێن بوو وەک بارەگای پەروەردەیی پەک.

جار جارە هاتووچۆمان پێ دەکرا لەنێوان دێی چنارە و بیانا و ئێندزا و بۆکریسکان، بەڵام دێی چنارە بارەگای سەرەکیمان بوو وەک مەدرەسەی پەروەردە.

لەماوەی نزیکەی ٨ مانگ مانەوەم لەگەڵ گەریلا و کادیرانی بواری پەروەردەیی ئاپۆچی چەندین کەسیاتیم بینی سەردانی ئەو بارەگایانەیان دەکرد کە ئێمەی لێبووین.

بارەگاکەی ئێمە لە دێی چنارە ژمارەی چەکدارەکان بەپێی کات دەگۆڕا، لە ٢٥ چەکدار تا ٦٠ چەکدار بەردەوامی هاتوچۆیان دەکرد و، خەریکی چالاکی و هێنان و بردنی زانیاری بوون لەگەڵ ئێمە کە ٢٥ کەس بووین.

دێی چنارە کە ناوەکەی لای پەک وا ناسراوە، لە بنەڕەتدا ناوی دێیەکە "بانی نور"ە، سەر ڕێگای بارەگای سەرەکی و سەرکردایەتی پەک بوو لە قەندیل، بۆیە هەر کەس بهاتایە لەوێوە دادەبەزی.

یەکەم کەس بینیمان لە ٢٠٠٨/٩/١٩ نوێنەری مراد قەرەیلان بوو بەناوی موهەمەت تۆرکان کە هاتبوو وەک سەرەتایەک ئاشنامان بکات بە پەروەردەی ئاپۆ.

لە قسەکانیدا پێی وتین:

١- ئێمە دژی تورک نین.

٢- ئێمە دۆستی ئەرمەنی و یۆنان و تورکین.

٣- ئامانجی ئێمە دابەشکردنی تورکیا نییە.

٤- کار دەکەین بۆئەوەی دین لە دەوڵەت دابڕێنین و هیچ پیاوێکی ئایینی بۆی نەبێت ببێتە پیاوی دەوڵەت.

٥- باوەڕمان بەپێکەوە ژیانی گەلان هەیە، بەڵام پێکەوە ژیانێکی ئازادانە و دوور لە هەژموونی ئایین و کەسایەتییە ئاینییەکان.

٦- برایەتی گەلانی ئەرمەن و یۆنان و تورک لەژێر سایەی سیکۆلاریزمدا.

٧- ئازادی ئاین و نەهێشتنی پیرۆزییەکانی.

٨- هەموو ئەوانە سەرۆک ئاپۆ خەباتی لەپێناودا کردووە، وەک خوێندکارێکی مستەفا کەمال بەڵێنی داوە رێگری بکات لە گەڕانەوەی

تورکیا بۆ سەردەمی ستەمکاری ئال عوسمان.

٩- دەبێت بەڵێن بدەین دڵسۆز بین.

دەبێت ئەوەم بیر نەچێت لەو کاتەی لەوێبووم نوێنەری جەلال تاڵەبانی بەناوی "بەهرۆز گەلالی" لە ٢٠٠٩/٢/١٣ هاتە قەندیل.

سێ کەس لە قەندیل بە کۆپتەر نیشتنەوە؛

یەکەمیان:

ئارشاک مانۆکیان بوو لە ٢٠٠٩/٣/١٥ سەردانی قەندیلی کرد.

دووهەمیان:

ئیفوسیموس کوستوبولوس بوو لە ٢٠٠٩/٤/٢١ بە لە قەندیل نیشتەوە.

سێهەمیان:

ئالان گێپغات بوو ئەویش بە فڕۆکە سەردانی قەندیلی کرد.

دوایی کە لە قەندیل ڕامان کرد بۆمان دەرکەوت ئەوانە کێ بوون کە لەو بەروارانەدا هاتن.

لە ٢٠١٩/٣/٥ چووم بۆ نوسینگەی قونسوڵخانەی ئەرمینیا لەهەولێر بۆ وەرگرتنی ڤیزای خوێندن بۆ برادەرێک. وێنەیەکم بینی، پرسیارم کرد ئەوە کێیە؟

کارمەندی نوسینگە وەڵامی دامەوە، وتی ئەوە وێنەی ئارشاک مانۆکیان قونسوڵی ئەرمینیایە لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی ئەرمینیا.

ڕۆژێکیش لە تەلەفزیۆن قونسوڵی یۆنانم بینی هەمان ئەو کەسە بوو لە قەندیل بینم بەناوی ئیفوسیموس کوستوبولوس. بۆیە گومانم بۆ دروست بوو لە گوگڵ سێرچم کرد بەدوای ئالان گێپغات ئەویش

قونسوڵی فەڕەنسا دەرچوو لە عێراق.

لەماوەی بوونمان لە قەندیل گەیشتینە کۆمەڵێک زانیاری لەبارەی داهاتی پەک:

- بودجەی ساڵانەی پەک دەگاتە نزیکەی ١٥٦ ملیۆن دۆلار.
- داهاتەکانی پەک لەسەر چەندین پڕۆژە و کارگەی بچووکە لە ناوەخۆ و دەرەوەی تورکیا کە لەلایەن لایەنگرانیان بەڕێوە دەبرێن، هەروەها بازرگانی کردن بە تلیاک و مادەی هۆشبەر یەکێکە لە سەرچاوەکانی داراییان.
- ٣٧٥ کۆمپانیا و پرۆژەی بچووک و سەرچاوەی دارایی لە ناوەخۆی تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا.
- ٤٥ کۆمپانیای گەورەی وەبەرهێنان لە وڵاتانی دژی تورکیا.
- کارگەی بەرهەمهێنانی زەیت لە سوریا.
- ٧٣ کارگەی بەرهەم هێنان و مۆڵی بچووکی جل و بەرگ لە ناوەخۆی تورکیا.
- لە ئێران و عێراق ٥ باندی بازرگانی تلیاک.
- لە عێراق زیاتر لە ١٣٠ پڕۆژەیان هەیە لە هەولێر و سلێمانی، کە زۆربەی لەناوچەکانی قەزای سۆران و ڕانیە دان.

هەر لەماوەی مانەوەمان لە قەندیل گەیشتین بە زانیاری ژمارەی چەکدارەکانی پەک و بنکە و بارەگاکانیان.

ژمارەی چەکدار و کادیرانی پەک نزیکەی ٥٠ هەزار دەبێت، لە هەموو نەتەوەکانی ناوچەکە پێکهاتوون:

- ٥٠٠٠ کوردی باکور
- ٨٠٠٠ کوردی عێراق
- ٧٠٠٠ کوردی سوریا

- ٣٠٠٠ کوردی ئێران
- ٨٠٠٠ ئەرمەنی
- ٧٠٠٠ یۆنانی
- ٣٠٠٠ ئێزیدی
- ٣٠٠٠ عەرەب
- ٢٠٠٠ بۆسنی
- ٤٠٠٠ تورک

لەگەڵ ژمارەیەک راوێژکار و سەربازی فەڕەنسی و ڕووسی کە خۆمان بینیمان چۆن راهێنانیان پێدەکردن.

بارەگا و بنکەکانیان لەباکوری عێراق:

- بارەگای سەرەکی قەندیل/ دێی چنارە، گارە، شەنگال، ئاری، بێصور.
- لە سنوری سلێمانی ٩ بنکە و بارەگای نهێنی هەیە؛
- لە سەر سنوری ئێران لە هەڵەبجە و پێنجوێن و ڕانیە.

کوردستانی ئێران:

دێیەکانی ماشکان، گردەسور، مامەندان، بێموزەرەتە، زێوە_ دێی حەلاج، تورگور، دەری، مەرمەند، زەرقان.

هەر لەڕێی ئەو دێهاتە کوردیانەی ئێرانەوەیە دەچنە ئەرمینیا.

لە ئەرمینیا:

- لەنێوان سنورەکانی ئاغاراک لەسەر سنوری هەرێمی دابرێندراوی نەخچەوانی ئازێربێجان بارەگایان هەیە، لە ناگۆرنۆ کاراباغ.
- لەدیوی ئەرمینیا لە ناوچەی ئاراقوس، قاریقیشلاق، قارەشین.
- لە دیوی ئازەربێجانیش لە ناوچەی قورەباغ لە ناوچەکانی میریک،

سوس، لاچین، زابوخ... بارەگایان هەیە و چالاکی و جموجۆڵ دەکەن، دژی تورکیا.

*تێبینی(ئاریوس):

"مەگەر ئەرمینیا خاکی کوردی داگیر نەکردووە بەهەمان پێوانەی قەومچییەکان، بڕوا ناکەم زۆرێکیان بزانن شاری دڤین و یەریڤانی ئەرمینیا دوو شاری کوردی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی شەدادی بوون ۱۰۰۰ساڵ پێش ئێستا، هەروەها لەوانەیە نەزانن کە سەلاحەدینی ئەیوبی لە دڤینی ئەرمینیا لەدایک بووە!

دەی مەگەر پێویست نییە ئازاد بکرێت؟! ئەگەر پەکەکە کوردایەتی دەکات بەڕاستی و، پیلانی ڕۆژئاوا نییە دژی ئیسلامییەکانی تورکیا، ئەوا هەوڵی ئازادکردنی هەموو خاکی کوردستانی دەدا نەوەکو خاک بۆ ئەرمینیا ئازاد بکات."

لەسەر سنورەکانی تورکیا - یۆنان:

لە دارستانەکانی ئەڤینکۆ، سۆوفلی، ئاگریانی، تایچێرۆ، دورگەی ثاسۆس، دورگەی لیمنۆس، دورگەی ثامۆسراکی چالاکی ڕێگری دەکەن و بوونەتە پاسەوانی سنوری یۆنانی لەگەڵ ژمارەیەک چەکدار و کادیری پەک لە ڕیزەکانی پاسەوانی سنورەکانی یۆنان کار دەکەن.

سنوری تورکیا - بولگاریا:

ئێلهێڤۆ، لێسۆڤۆ، بۆلیارۆچۆ، مۆمینا، گۆلیامۆ چالاکی چەتەیی و ڕێگری و جموجۆڵ ئەنجام دەدەن.

بنکەی دووهەمی سەرکردایەتی لە دەشتی بیقاع وەک نوسینگەی پەک بۆ کاروباری وڵاتانی عەرەبی. لە سوریاش وەک ئاشکرایە لەکوێ هەن بەفەرمی بارەگایان هەیە.

ژمارەی چەکدارەکانی پەک لە وڵاتانی دژ بە ئەمنی قەومی تورکیا:

- ٥٠٠٠ چەکدار لە سنورەکانی قەرەباغ و نەخچەڤان و ئەرمینیا، بۆ بەرگری لە پڕۆژەی ڕوسی - ئەرمەنی.

*(دروستکردنی ئەرمینیای گەورە کە پایتەختەکەی شاری دیاربەکرە. هیچت لەسەر نییە جگە لەوەی لە گۆگڵدا بنوسیت "مشروع ارمينيا الكبرى" تاوەکو بزانیت نەخشەی ئەو پڕۆژەیە چۆنە).

- ١٥٠٠ چەکدار لە سنورەکانی یۆنان - تورکیا بۆ بەرگری لە سنورەکانی یۆنان و جێبەجێ کردنی پیلانگێڕی فەرەنسا - یۆنان.
- ٧٠٠٠ چەکداری عەرەب و کوردی سوری لە سوریا بۆ جێبەجێ کردنی پیلانگێڕی ڕوسیا - ئێران - ڕژێمی ئەسەد.

پەیوەندی ئیستیخباری لەنێوان دەزگای ستاندار – پەکەکە - ئێران، پێدانی زانیاری بە پەک و ئێران لەلایەن دەزگای ستنادارەوە لەبەرامبەر ئەو بڕە پارەیەی ساڵانە لە ئێران و پەکی وەردەگرێت.

ساڵانە بڕی ١٠٠,٠٠٠$ لە ئێران وەردەگرێت لەبەرامبەر ئەو جاسوسییەی بۆیان دەکات.

## چەک و پێداویستی سەربازی لە ٢٠٠٧ ـ ٢٠٢١

Ak-47 کلاشینکۆف (٤٥٠٠ دانە)

- ٧١٪ ڕوسیا
- ١٤,٧٪ چین
- ٣,٦٪ هەنگاریا
- ٣,٦٪ بولگاریا

ڕەشاش چەک و بیکەسی (٥٧١٣ دانە)

- ٪٤٥,٢ ڕوسیا
- ٪٣٢,٢ فەڕەنسا
- ٪١٣,٢ ئەمەریکا
- ٪٩,٤ بەڕیتانیا

RPG قاضفة الصواريخ (١٦١٠ دانە)

- ٪٨٥ ڕوسیا
- ٪٥,٤ عێراق
- ٪٩,٦ ئێران

دەمانچە "مسدس" (٢٢٠٨ دانە)

- ٪٢١,٩ چیک و سلۆڤینیا
- ٪٢٠,٢ ئیسپانیا
- ٪١٨,٨ ئیتاڵیا
- ٪١٩,٥ ئێران
- ٪١٨,٦ عێراق

نارنجۆک "رمانە" (٧٠٠٠ دانە)

- ٪٧٢ ڕوسیا
- ٪١٩,٨ ئەمەریکا

- ٨,٢٪ ئەڵمانیا

مین "ألغام" (١١٥٧ دانه)

- ٦٠,٨٪  ئیتاڵیا
- ٢٨,٣٪ ڕوسیا
- ٦,٢٪ ئەڵمانیا
- ٤,٧٪ عێراق

چەکی ئێرانی (١٠٠٠٠ دانه)، دۆشکه (٢٣٠ دانه)

- ٤٠٪ فەڕەنسا
- ٢٠٪ بەڕیتانیا
- ٢١٪ ئێران
- ١٩٪ سوریا

فڕۆکەی چاودێری (٥٢٢ دانه)

- ٢٣٪ فەڕەنسا
- ١٩٪ ڕوسیا
- ١٨٪ ئێران
- ١٦٪ بەڕیتانیا
- ١٤٪ ئەمەریکا
- ١٠٪ ئیتاڵیا

جیاوازی پێدانی چەک و عیتاد لەنێوان ساڵی ٢٠٠٦ و ٢٠٢٠

لەلایەن وڵاتانی دژ بە تورکیا.

لەساڵی ٢٠٠٦دا

- ٢٦٪ ڕوسیا
- ٢١٪ فەڕەنسا
- ٢٠٪ سوریا
- ١١٪ ئەرمەن
- ١٠٪ یۆنان
- ٤٪ بەڕیتانیا
- ٨٪ ئێران

لەساڵی ٢٠٢٠دا

- ٢١٪ ڕوسیا
- ٢٠٪ فەڕەنسا
- ١٨٪ سوریا
- ١٦٪ ئێران
- ٦٪ بەڕیتانیا
- ٥٪ عێراق
- ٥٪ یۆنان
- ٥٪ ئەمریکا
- ٤٪ ئەرمینیا

## پاشکۆ

پەکەکە کیانێکی کوردی نا کوردییە. (ئیدی پێویستە موسوڵمانی کورد هۆشیار ببێتەوە بەرامبەر منالّ دزەکان).

قۆناغی دووهەم کە ئێمە لەئێستادا و ڕابردوویەکی نزیکدا تێیدا ژیاوین و، بەتەواوی ئەوە ڕوونبووەتەوە کە پەکەکە و ئێران پێکەوە هاوپەیمانن، نەک دژی تورکیایەکی عەلمانی، بەڵکو دژی ئیسلامی ناو تورکیا و مەزهەبی سونین.

ئێمە بەچاوانمان بینیمان کە پەکەکە دژی دیموکرات دەیان چالاکی ئەنجامدا، هەروەها لەساڵانی ٢٠٠٠ ـ ٢٠١٥ دەیان پێگە و شاخ لە ئێران بە حوکمەتی کۆماری بەناو ئیسلامی فرۆشرا.

هەروەها نابینین دژایەتی ئێران بکەن لەسەر ئاستی ڕاگەیاندن و سیاسی لەگەڵ ئەوەی ئەو تاوانەی ئێران بەرامبەر کوردی ڕۆژهەڵات دەیکات وێنەی نییە لەم سەردەمەدا، بەڵام "لا حیاه لمن تنادی؟!"

تەنانەت هەردوولا لەجەنگی ئازربایجان و ئەرمینیا، زۆر بەڕوونی لەڕیزی ئەرمینیەکاندابوون! لەگەڵ ئەوەی کە ئازربایجان هاو مەزهەبی ئێرانە و، وا باوە کە ئێران لەگەڵ شیعەدا دەوەستێت، کەواتە پێویست بوو لەگەڵ ئەوانیش بووەستێت، بەڵام بە پێچەوانەوە بەرەنگاریان بووەوە لەڕێی ڕاگەیاندن و تەنانەت سوپاشی نزیک سنورەکانی ئازربایجان - ئێران کۆکردەوە!

بەهەمان شێوە پەکەکە لەڕاگەیاندنەکانیاندا هەمان مۆرکیان پێوە دەردەکەوت.

لەسوریاش وەک هەمووان ئاگادارن کە تاڕادەیەکی باش میلیشیاکانی

بەشار ئەسەد و قەسەدە، کە باڵی پەکەکەیە لەو ناوچەیە لەیەک نزیک بوونەتەوە و، دوور نییە لەماوەی داهاتوودا پێکبێن و، ساڵح موسلیم خۆی پێشتر وتی کە مانعێکمان نییە لەوەی بچینە ژێر چەتری ڕێژێمەوە! ئەو ڕژێمەی کە ئامادە نەبوو ناسنامەی سوری بدات بە کورد.

هەروەها لە وتەکانی هاوڕێمان کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە ڕادەی نزیکی ئەرمینیا و یۆنان تا ئەمڕۆ دەردەکەوێت، کە چۆن چەکداری پەکەکە لەسنورەکانیان لەگەڵ تورکیادا جێگیر کراوە، ئەمەش بۆ بەکارهێنانیان لەکاتی پێویست دژی تورکیا! (تورکیایەکی ئیسلامی).

لەناوخۆی تورکیاش هەدەپە هێندەی مافی ئەرمەنییەکانی بەلاوە گرنگە، بەهێندەی ئەوە باس لە مافی کورد ناکات!

لەبەیانی حیزب لەساڵیادی بەناو جینۆسایدی ئەرمەن ٢٠٢١ دەڵێن: کە خاکی ئەنادۆڵ خاکێکی مەسیحی بووە و ئەرمەنییەکانی لێوەدەرنراوە!؟ بەڵام هیچ باسێکی کورد لەگۆڕێدا نییە، لەدرێژەی باسەکەدا.

هەروەها لەم دواییانەشدا، واتە دوای کودەتاکەی ٢٠١٦ لە ڕاگەیاندنەکاندا بەڕوونی هاوپەیمانی هەدەپە و قەومچییەکانی تورکیا دەبینرێت!

دەی کەواتە ئێوە داوای چ شۆڕشێک دژی تورکی شۆڤێنی دەکەن؟ مەگەر لە قەومچییەکان شۆڤێنی تر هەیە؟!

ئەگەر بێت و بەوردی تەماشای دۆخەکە بکەین بەپێی کۆبوونەوەی هێزە گەورەکان لەگەڵ پەکەکەدا، دەبینین دوو یاریزانی کارا ڕاسپێردراون لەلایەن دوو دەوڵەتی زلهێزەوە "فەڕەنسا و سۆڤێتی کۆن"، کە بریتین لە "ئەرمینیا و یۆنان".

ڕاسپێردراون بەئاگاداربوون و چوونە ناو هێزەکانی پەکەکە و

کۆنترۆڵ کردنیایان، ئەمەش هیچ کات لە بەرژەوەندی کورد نییە وەک باسی دەکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەڵایە بەسەر خودی کوردەوە چ وەک دین چ وەک نەتەوە، چونکە ئەرمینیای گەورە خۆی پایتەختەکەی دەکەوێتە شاری "دیاربەکر" وەک ئاماژەمان پێدا.

ئەم دەوڵەتەش سیاسی و بیرمەند و کاراکانی ئەرمینیا هەوڵی بۆ دەدەن، لەڕێگەی چەپەکانی هاوشێوەی "کەمال کلچدار ئۆگلۆ" کە دایکی ئەرمینییە!

هەروەها لەڕێگەی پەکەکە کە خۆیان وەک پارێزەری کوردستان نیشان دەدەن، بەڵام چ پارێزەرێک؟!

پارێزەرێک کە هیچ کات ڕزگاری کورد و ئاینی کورد و نەتەوەی کوردی لا گرنگ نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تا سەر ئێسقان دژی ئاینەکەیەتی، (لەکاتێکدا کورد بێ ئیسلام خاوەنی هیچ مێژوویییەکی دیار نییە، جگە کۆمەڵێک پاشماوە کە گوایە دەوڵەتێک هەبووە بەناوی ماددەوە لەسەدەی ٦پ.ز، کە هەندێک لە مێژوونووسان گومانیان هەیە لە کوردبوونی و، پێیان وایە لە ڕوسیاوە هاتوون. هەروەها کۆنترین مێژوونووسیش کە باسی لێوە کردوون هرۆدۆتە کە دەیانکات بە ٦ هۆزەوە و تەنها ناوی ئاریان لێدەنێت، زانراویشە گەلە ئارییەکان زۆرن و تەنها کورد ناگرێتەوە، ئەوجا وا دەردەکەوێت کە ئەم ئیمپڕاتۆریەتە تایبەت نەبووبێت بە کوردەوە ئەسڵەن، بەڵکو خێزانێکی دەسەڵاتدار بوون نەزیاتر، ئنجا مەرجیش نییە کوردبوو بێتن بە تێگەیشتنی ئەمڕۆ).

پەکەکە ئامادە بووە لەگەڵ هەمووواندا یەک بگرێت دژی هەر کیانێکی ئیسلامی لە ناوچەکەدا، ئەوجا بەزانین بێت یاخود نەزانین. لێرەدا ئێمە تەماشای ئێران بە کیانێکی ئیسلامی ناکەین، تاوەکو هەڵە نەگات، بەڵکو ئێران شیعەیەکی دوریووە بە بەری فارسدا نەزیاتر.

تەماشای پەکەکە و دووژمنانی ئیسلام بکەن لە ڕاگەیاندنەکاندا، هەروەها بزانن کامەیان لە هەمووان زیاتر دژی ئیسلامە ئەوەیان نزیکترینە لە پەکەکەوە (فەڕەنسا، یۆنان، ئەرمینیا، ڕوسیا، هتد...).

پێویستە هەموو تاکێکی موسڵمان ئەم تاقمە بناسێت و بزانێت لەپێناو چیدا دروستکراوە و چ مەبەستێکی لەپشت خۆیەوە هەڵگرتووە، هەروەها بەرچاو ڕوونیشبێت لەشێوازی مامەڵە کردنیان.

وەک ئاگادارین کە لەئێستادا دوای ئەو گەندەڵی و فەسادەی کە لەحوکمەتی موچە خۆری ڕۆژئاوادا لەکوردستان بینرا، خەڵکی بەشوێن تروسکاییەکدا دەگەڕێن و، پێیان وایە هەر فتیلەیەک لەو نیوە شەوەدا خۆری ڕزگارییە.

وا دەبینن کە پەکەکە ئازادی و خۆشگوزەرانی و یەکڕیزی و پارێزگاری و ڕزگاریان بۆدەهێنێت، بێئاگا لەوەی ئەمانە دەستێکی ئەرمینی و یۆنانیەکانن و هەر بەتەواوبوونی کارەکەیان بە پەڕۆیەکی پیس فڕێدەدرێنە زبڵدانی مێژووە و دەبنە ڕابردوو.

زۆر مەترسیدارە مرۆڤ چاوی خۆی داخات لەواقع، ئنجا ئەو بابەتە بەڕوونی نەبینێت و نەپرسێت لەخۆی؟ بۆچی پەکەکە لە سەربازگەکانیان ژیانی مستەفا کەمال دەخوێنن و بە پێشەوای دەزانن؟

بۆچی دەبێت لەسێ پارچەی کوردستاندا ڕۆڵیان هەبێت جگە ئەو پارچانەی دەکەوێتە ئێران و ئەرمینیا، لەگەڵ ئەوەی بڕواش ناکەم دان بەبوونی ئەو بەشەی ئەرمینیادا بنێن، لەکاتێکدا مێژوو تۆماری کردووە کە ئەو جێگەیە خاکی دەوڵەتی شەدادی ئیسلامی کوردی بووە!

بۆچی لە ٢٠١٣دا چووە سوریا و دژی شۆڕشگێڕان وەستایەوە لەکورد و عەرەب، هەروەها بەژداری کرد لە گێڕانەوەی ڕژێمی بەشاری بەکرێگیراوی ئێران و ڕوسیا!؟

بۆچی هەموو حیزبە کوردییەکانی لەناوبرد یان بچووکی کردنەوە لەسوریا؟!

ئایا ئەگەر تورکیا لەلایەن عەلمانییەکانەوە حوکم بکرایە بەوجۆرە دەبوو دژیان؟!

ئایا ئەگەر بزاوتی ئیسلامی لە تورکیا پەرەی نەستانایە ئەسڵەن پەکەکە دروست دەبوو؟

ئەم بۆچییانە و دەیانی دیکە پێویستە وەڵام بدرێنەوە.

پێویستە تاکی موسوڵمان ئیمانی خۆی نەدۆڕێنێت لەپێناو هیچ شتێکدا و یەکلا ببێتەوە لەسەر ئەو کیانانەی کە بۆ دژایەتی دینەکەی دروستکراون.

پێویستە هەر تاکێکی موسوڵمان لەجێگەی خۆیەوە ڕووبەڕوویان بوەستێت.

لێرەدا من هیچ قسەیەکم بۆ هاوئاوازانی ڕۆژئاوا نییە و ئەوان دەمێکە خراونەتە بەرەی بەرامبەر کە دوژمنە، جا لەگەڵەکەی خۆمبێت یان نا گرنگ نییە، چونکە مرۆڤی موسوڵمان لەسەر بناغەی بیروباوەڕ بەئاینەکەی حوکم دەدات نەک هەستی نەتەوایەتی. ئەگەر وابوایە پێغەمبەرەکەی لە کوشتاری قورەیشەوە دەستی پێنەدەکرد کە لە مام و ئامۆزا و دۆست و خزمانی پێکهاتبوون، بەڵکو ڕووی دەمم لەو موسوڵمانەیە کە شانازی بە ئیسلامەتییەوە دەکات و پشتگیری بۆ ئەم کیانە دەستکردە بەکرێگیراوە دەردەبڕن و بەسەرکەوتنیان دڵخۆش دەبن.

پێویستە ئەو کەسە موسوڵمانە ئاگاداربێت کە کێ بەدۆست هەڵدەبژێرێت و، پشتگیری کێ دەکات. بڕوانێت ئایا هاوئاینییەتی و دروشمی بیروباوەڕەکەی بەرزکردووەتەوە یاخود شتێکی دیکە؟!

لە ئێستادا ئەم لایەنە کار لەسەر زۆرێک لە گەنجان دەکات لەڕێگەی ڕاگەیاندنەوە، کە ئاگاداری ئەم مێژووە سەرشۆڕیەی ئەم کیانە هەڵتۆقیوە نین. ئنجا لەژێر ناوی جیاجیادا هەوڵی سڕینەوەی مۆرکی ئیسلامەتی کورد دەدەن و دەیانەوێت بیگێڕنەوە بۆ سەردەمی پێش میلاد و، هیچ باس و خواسێکی ئەوتۆیان نییە لەسەر دەوڵەتەکانی ژێر خیلافەتی عەباسی و عوسمانی. ئەگەر باسیشی بکەن ئەوا کورد وەک هەڵگەڕاوەیەک دەهێننە پێش چاو، لەکاتێکدا ئەمین زەگی بەگ خۆی دەڵێت کە هەموو دەوڵەتە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی خیلافەت خاوەنی حوکمی زاتی بوون وەک هەموو دەوڵەتانی ناوچەکە[1].

هەروەها برایەتی نێوان کورد و عەرەب و فارس و تورک و تەنانەت بەڕبەڕیش کە لە مەغریبەوە لەسەردەمی فەتحی قودسدا خۆیان گەیاندە سوپاکەی سەلاحەدین دەشارنەوە.

ئەمەش بۆ ئەوەی لە عەقڵی ناوەخنی ئەم گەنجە قوربانیەدا بیسەپێنن بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ کە ئیسلام مافی نەداوە بەکورد! بۆیە پێویستە دژی بوەستینەوە! هەروەها هەموو دەوڵەتەکان ئێمەیان چەوساندووەتەوە!

بێ ئاگا لەوەی کە دەوڵەتی دۆستەکی کە دامەزرێنەرەکەی "باد"ە و کوردی ئیسلامییە، تەنانەت خودی خەلیفەش لێی دەترسا و دەوڵەتی حەمدانی و بووەیهییەکانی لەچەندین جەنگدا شکاند و هەوڵی گرتنی بەغدادی پایتەختیشی دەدا[2]!

دەوڵەتەکەی سەلاحەدین لەوپەڕی لیبیاوە درێژبووبووەوە تا دەگاتە موسڵ و ئەنتاکیا، لەکاتێدا لە مصرێکی عەربیدا دامەزرا، ئیدی ئەمە برایەتی ئیسلامی نێوان ئەم نەتەوانە نەبێت چییە؟!

سەلاحەدینێکی کوردی لە قاهیرەیەکی عەرەبیدا دەوڵەتێک بۆ ئیسلام

(١) تاريخ الدول والامارات الكرديه في عهد الاسلامي
(٢) تاريخ الدول والامارات الكرديه في العهد الاسلامي

دابمەزرێنێت و کوردیش سەرکردایەتی بکات و تورک و عەرەب سەربازبن لە سوپاکەیدا!

پێویستە بەرپەچی هەموو ئەم ئەفکار و بۆچوونانە بدرێتەوە لەجێگەی خۆیدا و، زوو ئاشکرا بکرێن و بناسێنرێن پێش بۆگەنکردنی عەقڵی گەنجانی بێ زانیاری و هەرزە و هەڵچوو.

والحمدلله رب العالمين

## سەرچاوەکەکان

١. معهد السلام الامريكي: لە ڕاپۆرتی ژمارە ١٤١ لە تەموزی ٢٠٠٥، نوسەر هێنری بارکی – بە ناونیشانی "تركيا والعراق، أخطار وإمكانات الجوار". باس لە مێژووی پەک و مەترسییەکانی دەکات.

٢. کتێبی "ملف ايديولوجية حزب العمال الكردستاني PKK"ی، نوسەر و ڕۆژنامەنووس محمد ئۆردۆغان بەزمانی تورکی و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. (لە لا ٤٥ تا ٩٨).

٣. بابەتی "کەسیرە" لە کتێبەکەی ئۆچ ئالانە و، مراد قەرەیلان لە یاداشتەکانی خۆیدا گێڕاویەتەوە و، هەروەها بیستنی ئەو بابەتە لەلایەن لە چەند سەرکردەیەکی پەکەکە لەقەندیل.

٤. کەسانی نزیک لە دامەزرێنەرانی پەکەکە لەهەندێک لەناوچەکانی کوردستانی باشوور، کە نەیانویستووە ناوی خۆیان بڵێن و، توانیومانە لەڕێگای برادەرانمانەوە پێیان بگەین و زانیاریان سەبارەت بەو کیانەی لێ وەربگرین.

٥. چەند سەربازێکی پەکەکە دوای وازهێنانیان لە ڕیزەکانی ئەو کیانە، هەروەها سود وەرگرتن لەئەزموونیان لەماوەی مانەوە لەگەڵیاندا.

# پێرست

